عليه السلام

# دابەزینی عیسا

## عیسا لەقورئان و فەرموودە صەحیحەکاندا بناسە

نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

١٤٤١ کۆچی
٢٠١٩ زاینی

# دابەزینی عیسا علیه السلام

## عیسا لە قورئان و فەرمودە صەحیحەکاندا بناسە


نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

خادم الإسلام



١٤٤١ کۆچی/ ٢٠١٩ زاینی






# ناوەڕۆک

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی:

یەکێک لە باسە گرنگ و عەقیدەی و غەیبییەکانی تایبەت بە ئوومەەی ئیسلام کە ئوممەتی ئاخیر زەمانە باسی عیسایە علیە السلام، یان ڕوونتر و ووردتر دابەزینی عیسایە علیە سلام.

(نزول عیسا ابن مریم في آخر الزمان) ئەم باسە بەدەلیلی قەطعی و نەصی صەریح تەثبیت بووە لە قورئان و لە فەرموودە و لە ئەقوالی هاوەڵان و لەلای سەلەفی ئوممەت گرنگی زۆریشی پێدراوە پشتیوان بە الله دەمەوێت بەشێوەیەکی پلەبەندی و وردوپوخت باسی بکەم لە سەرەتا تا کۆتایی و ناسینی عیسا ابن مریم علیە سلام، وەک چۆن گرنگە ناسینی مەهدی و دەجال بەهەمان شێوەش ناسینی عیسا علیە سلام گرنگە. دابەزینی عیسا و یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی پێش قیامەت و لەکاتێک دادەبەزێت کە موسڵمانان لەوپەڕی نارەحەتی و ئازاردان بەدەست دەجالی درۆزنەوە، کەوا لەهەر چواردەورەوە دەوریان لێگیراوە ئا لەم کاتە

بەشارەت و یەکێک لە پێغەمبەرە (ألوالعزم)ەکان دادەبەزێت کە دواتر بەوردی باسیان دەکەین. بۆیە من دەمەوێت لەسەرەتاوە تا کۆتایی بناسرێت، واتە بڵێن سیرەی عیسا علیه سلام.

**بۆ ئەمەش دابەشی دەکەم بۆ چەند باسێک کە ئەوانیش:**

**باسی یەکەم:** بڕواهێنان بەدابەزینی عیسا لە کتێبە عەقیدەییەکاندا.

**باسی دووەم:** باسی عیسا علیه السلام لەقورئاندا.

**باسی سێیەم:** دابەزینی عیسا علیه سلام لەفەرموودە صحیەکاندا.

**باسی چوارەرم:** ئەو (آثر)انەی لەسەری هاتوون.

**باسی پێنجەم:** دەرئەنجامی سەرجەم فەرموودە و آثرەکان بەپووختی.

## باسی یەکەم: بڕواهێنان بە دابەزینی "عیسا" لە کتێبە عەقیدەییەکاندا.

بۆیە ئەمەیان لەسەرەتادا باسدەکەم چونکە دەیبەستمەوە بە لایەنی عەقیدەوە، واتە خاڵێکە لە خاڵە گرنگەکانی عەقیدەی ئیماندار. باوەڕبوون بەوەی کە عیسا علیه سلام دادەبەزێت لە کۆتا زەمان یەکێکە لە مەسائیلە عەقیدەییەکانی ئەهلی سونە و جەماعە. بۆئەمەش چەند کتێبێکی عەقیدەیی ئاماژە پێدەدەم وەک:

١. لە شەرحی (السنه للبربهاری)دا هاتووە:

والإيمان وبنزول عيسى ابن مريم، ينزل فيقتل الدجال ويتزوج، ويصلي خلف القائم من آل محمد ﷺ، ويموت، ويدفنه.

واتە بڕوابوون بە دابەزینی "عیسا ابن مریم" علیه سلام کە "دەججال" دەکوژێت و ژن دەهێنێت و نوێژ لەدوای ئیمامی ئوممەتی "محمد" دەکات، واتە مەهدی علیه سلام و دەمرێت و دەنێژرێت.

٢. هەروەها لە (أصول السنه)ی "إمام أحمد بن حنبل الشیبانی" یەکێک لە ئیعتیقادەکان ئەوەیە کەوا ئیمان هێنان یان باوەڕبوونە بەدابەزینی "عیسا" علیه السلام لەکۆتا زەمان و کوشتی "دەججال" لە (باب لد).

٣. لە (رساله اعتقاد اهل السنه والجماعه)ی "ابن قدامه المقدسی" یەکێک لە ئیعتیقادەکان بڕواهێنانە بە بەدابەزینی "عیسا" علیه سلام لەکۆتا زەمان و کوشتنی "دەججال"ە.

٤. هەروەها لە (عقیدة الطحاوي)دا کە یەکێکی ترە لە کتێبە عەقیدەییەکانی سونە، بریتییە لە باوەڕبوون بە نیشانەکانی قیامەت و "دەججال" و دابەزینی عیسا علیه السلام.

ئەمە بیروباوەڕە واتە (اعتقادی أهلی السنه)یە، بۆیە لە هەموو کتێبە عەقیدەییەکان مەوجودە ڕەفزکردن و بڕوانەبوون بەوەی کە دانابەزێت ڕەفزی چەندان ئایەت و فەرموودەیە، بەمەش لە مەیلە دەچیتەدەر و کافر و مورتەد دەبێت و خوێن و ماڵی حەڵاڵە.

## باسی دووەم: باسی "عیسا" علیه السلام لەقورئاندا.

### عیسا کێیە و چۆن دروست بووە و بۆ چی قەومێک نێردراوە؟

لەسەرەتادا دەبێت ئەوە بزانرێت دروست بوونی عیسا علیه السلام هەر موعجیزە بووە وەک، قال الله تعالی: آل عمران: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾﴾[١].

الله پێمان دەڵێت نمونەی دروستبوونی "عیسا" علیه سلام وەک نمونەی "ئادەم"ە علیه سلام کە لەخۆڵ دروستی کرد بە (کن فیکون) واتە ئادەم علیه سلام بێ باوک و بێ دایک لەخۆڵ و قوڕ دروستی کردووە بە (کن فیکون) بەهەمان شێوەش (ابن مریم)ی بەبێ باوک دروست کردووە.

لەزۆرینەی زۆری ئایەتەکانی قورئاندا الله تعالی لەکاتی ناوهێنانی عیسا علیه سلام دەفەرموێت عیسا ابن مریم تەنها لە

١ سورة آل عمران: ٥٩

دوو سێ ئایەت نەبێت ئەمەش وەک ڕەد بۆ ئەو بوختانەی کە دەڵێن کوڕی خوایە.

عیسا علیه سلام لە "مریم بنت عمران" دروست بووە کە "مریەم" یەکێک بوو لە کچە پاکیزە و پاک و هەڵبژێردراوەکان وەک: ﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾﴾[١].

لەم ئایەتە (رسول) کە ملائیکەیە الله ناردوویەتی بۆلای مەریەم بەوەی کەوا الله هەڵیبژاردووە و پاکی کردووەتەوە و لەسەر هەموو ئافرەتانی جیهان هەڵیبژاردووە، وەک لە (صحیح بخاری)دا هاتووە رسول الله ﷺ دەفەرموویت: (کمل من الرجال کثیر ولم یکمل من النساء الا مریم بنت عمران وامرأة فرعون)...

واتە مەبەست لە چاکی و پلەوپایەیە کە (رجال) پیاوانێکی زۆر پێغەمبەر بوونە و ئەولیابوونە، بەڵام لەنێو ئافرەتان زۆر کەمبوون لەپلەبەرزەکان کە مەریەم و ژنی فیرعەونە...

١ سورة آل عمران: ٤٢

هەروەها لە (صحیحین)دا هاتووە دەفەرموویت: (خير نساءها مريم بنت عمران وخير نسائها خديجة بنت خويلد)[١]...

فەضڵ و پلەوپایەی مەریەمی پاکیزە و پاک زۆرە، بەڵام ئەمە کافییە تا بزانریت "عیسا ابن مریم" لە چی دایکێکە، بۆیە کاتێک ملائیکە لەشێوەی مرۆڤ دەچێتە لای، قال الله تعالى: ﴿قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ١٨﴾[٢].

لێرەدا مەریەم پەنای گرتووە بە الله چونکە ترساوە کە زیانی لێبدات، بەڵام لە وەڵامدا پێی دەڵێت، قال الله تعالى: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ١٩﴾[٣].

واتە مەترسە من نێردراوی اللهم تاوەکو منداڵێکی ژیر و عاقڵت پێ ببەخشێت.

---

١ بخاری، مسلم.

٢ سورة مريم: ١٨

٣ سورة مريم: ١٩

هەروەها قال الله تعالی: ﴿إِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ ٱسۡمُهُ ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ وَجِيهٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ٤٥ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٤٦﴾[١].

لەم دوو ئایەتە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کەوا تەنانەت خودی ناوی عیسا لەلایەن اللهوە ناوی لێنراوە (المسیح عیسی ابن مریم). جا یەکێک لە موعجیزە گەورەکانیشی ئەوەیە کەوا (یکلم الناس فی المهد) واتە لەنێو بێشکە و بچکوولە یە کەوا قسە لەگەڵ خەڵک دەکات، لە فەرموودە واریدە بە صەحیحی کەوا هیچ کەس بەبچووکی قسەی نەکردووە جگە لە سێیان نەبێت عیسا ابن مریم علیه سلام و منداڵی داوێن پیسەکەی بووختانی بە "جریج" کرد، لەگەڵ یەکێکی تر.

دوای ئەوەی مەریەم بنت عمران حەملی دەبێت و ماوەکەی تەواو دەبێت بە منداڵی بچووکەوە دێتە نێو قەومەکەی، بۆیە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە پێی دەڵێن ئەی مەریەم نە باوکت خەراپ و نەدایکت ئەمە چییە؟ ئەمیش ئیشارەی بۆ دەکات و ئەوانیش

---

١ سورة آل عمران: ٤٥-٤٦

بەسەر سوڕمانەوە دەڵێن، قال الله تعالى: ﴿فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ٢٩ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ٣٠ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ٣١﴾[١].

واتە چۆن منداڵی بچووک و ساوا قسە دەکات؟ ئنجا عیسا علیە سلام وەڵام دەداتەوە کەوا من (عبدالله)م!

سبحان الله یەکەم وشەی عیسا ابن مریم شاهێدی دان، بۆئەوەی کە ئەو بەندەیەکە لەبەندەکانی الله (إنی عبدالله). ئەمەش وەک ڕەددێکە بۆ بوختانکەران و جولەکە و گاور کە دەڵێن کوڕی خوایە و هەندێک دەڵێن خوایە. پاکی و بێگەردی بۆ الله لە هەموو شرکێک، بۆیە هەر لەهەمان سورەت و ئایەتی دوای ئەمە الله پاکبوونی خۆی لەهەموو جۆرە هاوبەشێک دووپاتدەکاتەوە.

﴿مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٣٥﴾[٢].

١ سورة مریم: ٢٩-٣١

٢ سورة مریم: ٣٥

بۆیە الله پێویستی بەمنداڵ و هاوبەش نییە گەر مەبەست و نیەتی کارێکی هەبێت تەنیا دەڵێت ببە ڕاستەوخۆ دەبێت.

عیسا علیە سلام ئینجیلی پیرۆزی بۆ دابەزیووە واتە خاوەن بەرنامە و شەریعەتی تایبەت بووە. لەنێوان عیسا علیە السلام و رسول الله ﷺ هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە ماوەکەشیان زیاترە لەپێنج سەد ساڵ.

عیسا علیە سلام یەکێک لە موعجیزە هەرەگەورەکانی ئەوەیە کەوا لەئاسمانی دونیایە الله بەرزی کردووەتەوە چونکە جولەکە و گاور پێیاوان وابووە کوشتویانە وەک، قال الله تعالی: ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾[١].

لەم ئایەتە الله ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە لەبارەی ئەوەی کە دەیان گوت ئێمە (عیسا ابن مریم) مان کوشتووە، بەڵام لەڕاستیدا نەکوشتیان لە خاچیان دا بەڵکو هاوشێوەی بوو.

---

١ سورة النساء: ١٥٧

ئەم ئایەتەش ڕەدێکە بۆئەوانەی دەڵێن لە خاچدراوە وەک ئەو بەناو مەسیحی، تەبعەن مەسیحی نەماون پێیان دەوترێت (گاور)، کەوا وێنەی خاچیان لەکەنیسە و مەعبەدەکانیان داناوە بەحساب وێنەی عیسایە علیه السلام، بۆیە کاتێک دادەبەزێت صەلیب دەشکێنێت. بۆیە الله هەر لەنێو قورئان پێمان دەڵێت کەوا عیسا ابن مریم علیه سلام بەرزی ئاسمان کراوە، قال الله: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ﴾[1].

لەبارەی وشەی (متوفيك) موفەسیران چەند ڕایەکیان هەیە، بەڵام "إبن كثير" قەولی زۆرینە نەقڵ دەکات بەوەی کەوا، وقال الأكثرون: المراد بالوفاة هاهنا: النوم، كما قال تعالى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ [وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ]﴾[2].

واتە مەبەستی لەمردنی حەقیقی نییە بەڵکو خەوتنە، ئنجا بەرزکراوەتەوە. کەواتە عیسا علیه سلام بە نەصی ئایەت لە ئاسمانە تا کاتی دیاریکراوی خۆی کە کوشتنی "دەججالە"، بۆیە گاورەکان

---

١ سورە آل عمران: ٥٥

٢ سورة الأنعام: ٦٠

کە دەڵێن عیسا ابن مریم علیه سلام کوڕی خوایە درۆ دەکەن الله پێیان دەڵێت، قال الله تعالی: ﴿لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾[1].

عیسا علیه سلام هەر ئەم کات پێی دەوتن کەوا الله، خوای ئەو و ئێوەشە بۆیە دەبێت بیپەرستن وەک، قال الله تعالی: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٣٦﴾[2].

وەک لە فەرموودەی (إسرا و معراج)دا رسول الله لە ئاسمانی دووەم عیسا علیه سلام دەبینێت و سەلامی لێدەکات. ئەمە پووختەی باسی عیسا علیه سلام لەقورئان بوو.

١ سورة المائدة: ٧٢

٢ سوره مريم:٣٦

## باسی سێیەم: باسی دابەزینی عیسا علیه سلام لەفەرموودەکاندا.

بێگومان فەرموودەکانی دابەزینی عیسا علیه سلام زوره لە زۆرینەی صەحیح و سونەن و موسنەد و موصنەفەکان هاتووه به صەحیحی، وەک لە صحیح بخاری (كتاب أحاديث الأنبياء):

١- عَنْ نَافِعٍ مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ)؟

ئێوه چۆن دەبن ئەو کاتەی کەوا "ابن مريم" واته عیسا دادەبەزێت و پێشەواکەش لە ئێوەیە، واتە لەدوای یەکێک لە ئیمامەکان نوێژ دەکات کە مەهدیه علیه سلام.

٢- هەروەها لە صەحیحین واتە بوخاری و موسیلم هاتووه:

أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلًا، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ، حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ

خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ :﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ١٥٩﴾.

"أبا هريره" رضي الله عنه دەڵێت رسول الله ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ڕۆژێک دێت کەوا "ابن مريم" عیسا علیه سلام دابەزێت کە دادوەرێکی دادگەر و چاکەکارە صەلیب دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و جزیە هەڵدەگرێت و ماڵ و سامان زۆر دەبێت تا وای لێدێت کە کەس قبوڵی ناکات تا وای لێدێت یەک سوجدە خێرترە لە دونیا و ئەوەی تێیدا هەیە. ئنجا "ئەبو هرێرە" ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ١٥٩﴾.

لەم فەرموودە ئەوە ڕووندەبێت کە جزیە نامێنێت، واتە ئەهلی کتاب مەجبورن یان بلێین بەزۆر یان موسڵمان یان کوشتن.

ئیمامی "نووی" لە (منهاج شرحی مسلم) لەبارەی ئەم قەولە: وأما قوله ﷺ:(ويضع الجزية) فالصواب في معناه أنه لا يقبلها ولا

يقبل من الكفار إلا الإسلام ومن بذل منهم الجزية لم يكف عنه بها، بل لا يقبل إلا الإسلام أو القتل.

واتە مانای هەڵگرتنی جزیە ئەوەیە کەوا قبووڵ ناکرێت لە کافران تەنیا ئیسلام نەبێت، واتە گەر نەچێتە بازنەی ئیسلامەوە لێی قبوڵ ناکرێت یانیش کووشتن.

(بۆیە من دەڵێم) ئەم ئایەتە کە الله لەبارەی ئەهلی کتاب دەفەرموویێت: (حتی یعطی الجزیة)، دوای دابەزینی عیسا علیه سلام حوکمی نەسخ دەبێت والله أعلم.

٣- لە "سنن الترمزی"دا بە صەحیح هاتووە بەمشێوە لەبارەی دابەزینی عیساوە علیه سلام:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضُ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ).

واتە سوێند بەوەی نەفسمی بەدەستە کە مەبەست اللهیە، نزیکە بەوەی "ابن مریم" دابەزێت و حاکمێکی دادپەروەر و چاکەکارە،

صەلیب دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و جزیە هەڵدەگرێت و ماڵ و سامان زۆر دەبێت تا هیچ کەس نامێنێت قبووڵی بکاتن.

٤- له "سنن أبی داود" به صەحیحی هاتووه، له (کتاب الملاحم):

عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ آدَمَ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ - يَعْنِي عِيسَى - وَإِنَّهُ نَازِلٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ، رَجُلٌ مَرْبُوعٌ، إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ، بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ، كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيُهْلِكُ اللهُ فِي زَمَانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلَّا الْإِسْلَامَ، وَيُهْلِكُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يُتَوَفَّى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ)[١].

واته رسول الله ﷺ فەرمووی: هیچ پێغەمبەرێک لەنێوان من و عیسا علیه سلام دا نییە. ئەو دادەبەزێت ئەگەر بینیتان بیناسنەوە پیاوێکی مام ناوەندە لە باڵا، واتە نەدرێژ و نەکورتە لەنێوانیانە و جلێکی سور و سپی تێکەڵی لەبەردایە وەک بڵێیت لەسەری ئاوی

١ حکم الحدیث: صحیح

لێ دەتکێت. ئنجا شەڕی خەڵک دەکات لەسەر ئیسلام و خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و جزیە ناهێڵێت. هەروەها لەسەردەستی ئەودا الله کوفر لەنێو دەبات تەنیا ئیسلام نەبێت و مەسیحی "دەجال" لەسەردەستی لەنێو دەچێت و لەزەوی دەمێنێتەوە بۆماوەی چل ساڵ. ئنجا دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

٥- هەروەها لە "سنن ابن ماجە"، لە (باب فتنە دجال)دا هاتووە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، وَإِمَامًا عَدْلًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضُ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ).

واتە قیامەت هەڵناستێت تا عیسا علیە سلام دادەبەزێت. لەم فەرموودەیەدا زیاتر تەئکید لەوە دەکات هەر دەبێت دابەزێت و مەرجی پێش هاتنی قیامەتە.

٦- هەروەها لە "مسند احمد"، لە "مسندی ابو هریرە":

عَنْ عَطَاءِ بْنِ مِينَاءَ - مَوْلَى ابْنِ أَبِي ذُبَابٍ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَلَيَقْت).

٧- هەروەها لە "مسند احمد"، لە "مسندی ابو هریره":

عَنْ عَطَاءِ بْنِ مِينَاءَ - مَوْلَى ابْنِ أَبِي ذُبَابٍ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ، وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا ، وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ، وَالتَّبَاغُضُ، وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيُدْعَوُنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ)[1].

فەرموودەکان زۆرینەی ماناکانیان یەک مانایە.

٨- لە "صحيح مسلم"دا هاتووە:

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: (لا تقوم الساعة حتى ينزل الروم بالأعماق أو بدابقفيخرج إليهم جيش من المدينة من خيار أهل الأرض يومئذ، فإذ تصافوا قالت الروم: خلوا بيننا وبين الذين سبوا منا نقاتلهم، فيقول المسلمون: لا والله

---

١ حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لا نخلي بينكم وبين إخواننا، فيقاتلونهم، فينهزم ثلث لا يتوب الله عليهم أبداً، ويقتل ثلث هم أفضل الشهداء عند الله، ويفتتح الثلث لا يفتنون أبداً، فيفتتحون قسطنطينية، فبينما هم يقتسمون الغنائم، قد علقوا سيوفهم بالزيتون، إذ صاح فيهم الشيطان: إن المسيح قد خلفكم في أهليكم، فيخرجون، وذلك باطل، فإذا جاءوا الشام خرج، فبينما هم يعدون للقتال يسوون الصفوف إذ أقيمت الصلاة، فينزل عيسى ابن مريم فأمهم، فإذا رآه عدو الله ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله الله بيده، فيريهم دمه في حربته).

واتە "أبو هريرە" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: قیامەت هەڵناستێت تا ڕۆمەکان لە (أعماق) یا (دابق) دادەبەزن، ئنجا لەشکرێکیان لە مەدینەوە بۆ دەردەچێت کە لە چاکترینی دانیشتوانی سەر زەوین لەو ڕۆژگارەدا، کاتێک ڕیز دەبن. ڕۆمەکان دەڵێن: وازمان لێبێنن با بجەنگێین لەگەڵ ئەوانەی کە لە ئێمە بوون و بەدیل گیران (موسڵمان بوون و ئێستا هاتوون دەجەنگن لەگەڵمان). موسڵمانەکان دەڵێن: نە بەخوا وازتان

لێناهێنین بجەنگن لەگەڵ براکانمان. ئنجا دەجەنگن لەگەڵیان، سێیەکیان لە جەنگەکە هەڵدێن خوا تەوبەیان لێقبوڵ ناکات، سێیەکیشیان دەکوژرێن کە چاکترینی شەهیدانن لەلای خوا، سێیەکەکەی تریشیان سەردەکەون، هەرگیز تووشی فیتنە نابن. ئنجا (قسطنطنیە) ئازاد دەکەن لەکاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەسکەوتی جەنگەکەن، شمشێرەکانیان بە دارزەیتونەوە هەڵواسیووە، شەیتان بەدرۆ لەناویاندا هاوار دەکات: "جەجاڵ دوای ئێوە چۆتە ناو ماڵ و منداڵتان". ئەوانیش دەردەچن کاتێک ئەوان سەرگەرمی خۆسازدان دەبن بۆ جەنگ ڕیزەکانیان ڕێک دەخەن قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، "عیسا"ی کوڕی "مریم" (سەلامی خوای لێ بێت) دادەبەزێت، پێش نوێژییان بۆ دەکات، کاتێک دوژمنی خوا دەیبینێت دەتوێتەوە وەک چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە. خۆ ئەگەر وازی لێبهێنایا، خۆی لە خۆیدا دەتوایەوە تا لە ناودەچوو، بەڵام خوا بەدەستی ئەو دەیکوژێت، خوێنەکەی بە ڕمەکەیەوە نیشانیان دەدات.

٩- له‌ فه‌رمووده‌ی صه‌حیح که‌ چه‌ند پێشه‌وایه‌ک ڕیوایه‌تیان کردووه‌ قیامه‌ت نایات تاوه‌کو ده‌ نیشانه‌ ده‌رنه‌چن، یه‌کێک له‌وانه‌ (نزول عیسی) دابه‌زینی عیسایه‌ علیه سلام[1].

١٠- عن مجمع بن جارية الأنصاري رضي الله عنه يقول: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (يقتل ابن مريم الدجال بباب لد)[2].

واته‌ عیسا "ابن مريم" علیه سلام ده‌ججال ده‌کوژێت له‌ (باب لد) یان له‌لای (باب لد)[3].

هه‌روه‌ها، وينزل عيسى ابن مريم عليه السلام عند صلاة الفجر، فيقول له أميرهم: يا روح الله تقدم صل، فيقول: هذه الأمة أمراء بعضهم على بعض، فيتقدم أميرهم فيصلي، فإذا قضى صلاته أخذ حربته فيذهب نحو الدجال، فإذا رآه الدجال ذاب كما يذوب الرصاص، فيضع حربته بين ثندوتيه فيقتله، وينهزم

---

١ أخرجه مسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجه.

٢ رواه الترمذي وقال: هذا حديث صحيح، ورواه أحمد في (مسنده) بأربعة طرق، وفي بعض طرقه: (إلى جانب باب لد).

٣ (باب لد) ناوچه‌یه‌که‌ له‌ سوریا.

أصحابه، فليس يومئذ شيء يواري منهم أحداً، حتى إن الشجرة لتقول: يا مؤمن هذا كافر، ويقول الحجر: يا مؤمن هذا كافر[١].

لەم ڕیوایەتەدا دەڵێت دابەزینی عیسا علیه سلام لەکاتی نوێژی بەیانییە ئەمیرەکەیان دەڵێت ئەی (روح الله) پێش کەوە و نوێژمان بۆبکە. ئەویش دەفەرمووێت ئەم ئوممەتە هەندێکیان بەسەر هەندێکی پێشەوان. مەهدی علیه سلام نوێژەکە دەکات و کاتێک نوێژەکە تەواو دەکات حەربەکەی دەگرێت و دەچێت بەرەوڕووی دەججال و، کاتێک دەججال دەیبینێت دەتوێتەوە و دەیکوژێت بە ڕمەکەی. شوێنکەوتوانیشی شکست دێنن هیچ شتێک نامێنێت پەنای بۆ بەرن تەنانەت دار و بەرد دەڵێن ئەی ئیماندار ئەوە جولەکەیە یان کافرە ، لە هەندێک ڕیوایەت دەڵێت وەرە بیکوژە.

١ أخرجه أحمد في (مسنده) واللفظ له بطريقين، وأخرجه ابن أبي شيبة والطبراني والحاكم وصححه، كما في الدرر المنثورة.

١١- هەروەها لە، ابن عباس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: (لن تهلك أمة أنا في أولها، وعيسى ابن مريم في آخرها، والمهدي في وسطها)[١].

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت ئوممەتێک لەنێو ناچێت کەوا من لەسەرەتاکەی بم و عیسا علیه سلام لەکۆتاییەکەی بێت و مەهدی علیه سلام لەناوەڕاستی بێت.

١٢- عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: (لم يسلط على قتل الدجال إلا عيسى ابن مريم)[٢].

واتە هیچ کەسێک زاڵ نابێت بۆ کوشتنی دەججال جگە لە عیسا "ابن مريم" نەبێت.

---

١ رواه النسائي، وأبو نعيم فى (أخبار المهدي، والحاكم وابن عساكر فى (تاريخيهما). ولفظهما: (كيف تهلك أمة أنا في أولها....). كما في (كنز العمال). هذا حديث (حسن)، كما في (السراج المنير) للعزيزي.

٢ أخرجه أبو داود الطيالسي في (مسنده). كما في (الجامع الصغير) للسيوطي. وقال العلقمي: بجانبه علامة الحسن. كما في (السراج المنير).

١٣- عن أوس بن أوس الثقفي رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال: (ينزل عيسى ابن مريم عند المنارةالبيضاء شرقي دمشق)[١].

واتە عیسا "ابن مريم" لە (منارەی سپی) ڕۆژهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێت.

ئەمە پووختەیەک بوو لە فەرموودەکانی کەوا بە صەحیحی هاتووە لەسەر دابەزینی عیسا "ابن مريم"عليه سلام.

## باسی چوارەم: ئەو (آثر)انەی کە لەسەر دابەزینی عیسا علیه سلام هاتوون.

١- عن عبد الله بن عباس رضي الله عنه في قوله تعالى: ﴿وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ﴾. قال: خروج عيسى ابن مريم[٢].

١ أخرجه الطبراني كما في (الدر المنثور) و(كنز العمال)، وأخرجه ابن عساكر في (تاريخ دمشق).

٢ أخرجه الفريابي وعبد بن حميد والحاكم وصححه، كما في (الدر المنثور).

"إبن عباس" لە تەفسیری ئایەتی {وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ} دەرچوونی عیسا "ابن مریم"ە علیه سلام، مەبەست دابەزینە چونكە مەعلومە عیسا علیه سلام لە ئاسمانە.

٢- هەر لە "ابن عباس"ەوە دەڵێت مەبەست ئیمان هێنانی ئەهلی كتابە پێش مردنی، "ابن جریر" هێناویەتی.

٣- عن قتادة في قوله تعالى: {وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ}. قال: إذا نزل آمنت به الأديان كلها، ويوم القيامة يكون عليهم شهيداً أنه قد بلغ رسالة ربه، وأقر على نفسه بالعبودية[١].

"قتادە" لەبارەی ئەم ئایەتە دەڵێت كاتێک دابەزی هەموو ئەدیانەكانی تر بڕوای پێ دەهێنن و ڕۆژی قیامەتیش لەسەریان دەبێتە شاهێد كە ئەو ڕیسالەی اللّٰهی گەیاندووە.

٤- {وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ}. قال: قبل موت عيسى، والله إنه الآن لحي عند الله، ولكن إذا نزل آمنوا به أجمعون[٢].

---

١ أخرجه عبد الرزاق وعبد بن حميد وابن جرير وابن المنذر كما في (المنثور).

٢ أخرجه ابن جرير.

٥- عن الحسن أيضاً أن رجلاً سأله عن قوله تعالى: { وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ}. قال: قبل موت عيسى، إن الله رفع إليه عيسى، وهو باعثه قبل يوم القيامة مقاماً يؤمن به البر والفاجر[1].

ئیمامی "حسن البصری" رحمه الله تعالى، لەبارەی ئەم ئایەتە دەڵێت پێش مردنی عیسایە و سوێند دەخوات کە ئێستا زیندووە، لای اللهیە و کاتێک کە دادەبەزێت هەموو ئیمانی پێ دێنن. لە دووەمیان بەهەمان شێوە پێش قیامەت الله دەینرێت و چاک و خراپ بڕوای پێ دێنن.

٦- عن مجاهد في قوله تعالى: {وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ}. قال: صلبوا رجلاً غير عيسى، شبهوه بعيسى يحسبونه إياه، ورفع الله إليه عيسى حياً[2].

---

١ أخرجه ابن أبي حاتم كما في (الدر المنثور).

٢ أخرجه عبد بن حميد وابن جرير وابن المنذر.

"مجاهد" لە قەولی {شُبِّهَ لَهُمْ}، واتە کەسێکی تریان لە جێگای عیسا لە خاچدا کە شێوەی ئەو بوو وایان زانی ئەوە، بەڵام الله بەرزی کردەوە بەزیندوویی.

٧- عن ابن عباس رضي الله عنه في قوله تعالى: {وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ}. قال: خروج عيسى.

"حسن البصری" و "قتاده بن دعامه" لەبارەی ئەم ئایەتە مەبەست دابەزینی عیسایە علیه سلام پێش قیامەت بێگومان ئەمە کافییە بۆ تێگەیشتن.

## باسی پێنجەم: دەرئەنجامی سەرجەم فەرموودە و (آثر)ەکان بەشێوەی زنجیرە و خاڵ بەخاڵ.

١- دابەزینی عیسا علیه الصلاة والسلام یەکێکە لەباسە عەقیدەییەکانی ئەهلی سونە وجەماعە کە دەبێت وەک تاکی موسڵمان یەقین و بڕوای تەواوت بەم باسە هەبێت.

٢- دابەزینی عیسا علیه سلام یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی پێش قیامەت واتە سیلسیلەی تەسبیحی نیشانەکان پچڕاون.

٣- عیسا علیە سلام دانابەزێت تا ئەوکاتەی دەججالی درۆزن دەردەچێت، واتە مەرجە دەججال دەرچووبێت و هاتبێتـ ئنجا دادەبەزێت.

٤- دابەزینی عیسا لەکاتی نوێژە لە هەندێک ڕیوایەت نوێژی بەیانی وەک لەفەرموودەکان هاتووە دەفەرمووێت ئەمیرەکەیان دەڵێت وەرە پێش نوێژمان بۆبکە. ئەمیش دەڵێت نەخێر بەمجۆرە مەهدی علیە سلام پێش نوێژ دەکات، بەڵام دەبێت ئەوە بزانن کەوا کاتێک مەهدی علیە السلام نوێژ دەکات و عیسا "ابن مریم" لەدوای نوێژ دەکات، واتای ئەوە ناگەیەنێت کەوا پلەوپایەی عیسا (روح الله) بچووکتربێت لە مەهدی. نەخێر، عیسا علیە السلام یەکێکە لە پێغەمبەرە (ألوالعزم)ەکان یەکێکە لە پلە هەرە گەورەکانی هەیە، وەک الله دەفەرمووێت نمونەی عیسا و ئادەم وەک یەکن هەردووکیان بە (کن فیکون) بوون.

٥- دابەزینی عیسا علیە سلام لەکاتێکە کەوا موسڵمان لەوپەڕی نارەحەتیدان، دەججال گەمارۆی داون بۆیە لە (منارەی سپی) دادەبەزێت لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق. کەواتە دەججال لە قودس موسڵمانانی گەمارۆداوە.

٦- دەبێت عەقیدەت وابێت کە عیسا علیه سلام زیندووە و لە ئاسمانە لەکاتی دیاریکراودا الله دایدەبەزێنێت بۆ زەوی تاوەکو کاری خۆی تەواوبکاتن کارەکانی عیسا علیه سلام بریتین لەمانەی خوارەوە:

أ) **کووشتنی دەججال:** یەکەم کاری کوشتنی دەججالە هەر کە دادەزێت و نوێژ دەکات شوێنی دەکەوێت و دەیکوژێت.

ب) **شکاندنی خاچ یان (صلیب):** یەکێک لەئەرکەکانی عیسا علیه سلام خاچ دەشکێنێت بەمەش درۆی گاورەکان پووچەڵ دەکات کە دەڵێن لە خاچ دراوە.

ت) **کوشتنی بەراز:** یەکێکە لەکارەکانی عیسا علیه سلام ئەمەش تەصدیقی حەرامیەتی بەرازە.

ث) **هەڵگرتنی جزیە:** یەکێک لە کارەکانی عیسا علیه سلام نەهێشتنی جزیە، گەرچی هەندێک پێیان وایە مەبەست ئەوەیە ماڵ و سامان زۆر دەبێت، بەڵام صەواب وایە کەوا زۆرە ملێیە یان ئیسلام یان کوشتن، واتە ئەهلی کتاب حوججەیان لەسەر

نامێنێت بڵێن ئێمە شوێنکەوتەی عیساین، (زیمە)ش نامێنێت وەک ئەهلی ڕیددە تەعاملیان لەگەڵ دەکرێت واللە أعلم.

٧- کە دادەبەزێت دەبێت بچێتە سەر دینی ئیسلام واتە پابەند دەبێت بە شەریعەتی ئیسلام و کوشتاری خەڵک بۆهێنانە نێو ئیسلام دەکات و حەج و عەمرەش دەکاتن.

٨- کاتێک دادەبەزێت ژن دەهێنێت، بەمەش ئەو بە حیساب ئافرەتە گاورانە کە خۆیان لە کەنیسە وەک کچ هێشتووەتەوە گوایە بۆ عیسایە علیە سلام، بەڵام ئەو ژن دەهێنێت بەمەش ئەو باوەڕە پووچەی بەناو مسیحییەکان هەڵدەوشێنێتەوە.

٩- دوای دابەزینی و مردنی مەهدی علیه سلام عیسا "ابن مریم" چەند ساڵێک دەمێنێتەوە حاکمێکی عادل و چاکەکار دەبێت بەجۆرێک گورگ و مەڕ ئاو پێکەوە دەخۆن، شێر زیان بەپیاو ناگەیەنێت منداڵ یاری لەگەڵ ماردا بکات زیانی لێنادات. بەهۆی عەدالەتەکەی وادەکات ماڵ و سامان هێندە زۆربێت کەوا کەس نامێنێت ماڵت لێ قبووڵ بکات، چونکە پێویستی پێی نییە، ئەمەش دەلالەتە لە حوکمی ئیسلام و قورئان ئەگەر عەدالەتی ئیسلام هەبێت گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆن

هەژاری نامێنێت، چونکە یەکێک لە ئەرکانەکانی ئیسلام زەکاتە کە لەدەوڵەمەندەکان دەسەنرێت و دەدرێت بە هەژارەکان. بۆیە ئەم هەژاری و دەربەدەرییەی ئەمڕۆ بەهۆی ناعەدالەتی و نەمانی حوکمی ئیسلامەوەیە.

١٠- دوای مانەوەی ماوەیەک، ئنجا دەبێت بمرێت بەمەش ئەم باوەڕە پوچەی گاورەکان پوچ دەکاتەوە کە دەڵێن (المسیح) اللهیە، واتە سیفەتی نەمری دەدەنە پاڵ، بۆیە دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

١١- عیسا علیه السلام دوای دابەزینی و کوشتنی دەججال ئەوا حوکم بە قورئان دەکات و دەعوە و بانگەوازی لەسەر قورئانە نەک ئینجیل.

لەکۆتاییدا دابەزینی عیسا علیه سلام یەکێکە لە موژدە خۆشەکان، چونکە لەکاتێکدا دێت کە موسڵمانان لەوپەڕی نارەحەتیدان زەوی بەهۆی دەججالەوە پڕ لە فەسادبووە.

ولله الحمد والمنه توانیم ئەم باسە کە لەڕێکەوتی ٣١-١٠ شەوی هەینی دەستم پێکرد لە ڕۆژی هەینی دوای عصر ١-١١ تەواوبوو ئەمەش فەضڵی اللهیە بەسەرمانەوە.

**والحمد لله رب العالمين.**

## سەرچاوە بەکارهاتووەکان:

١. شرح السنه للبربهارى.
٢. أصول السنه إمام أحمد.
٣. رسالة أعتقاد ، لمعة الأعتقاد، أبن قدامه المقديسى.
٤. كتب التسعة (صحيح بخارى)، (صحيح مسلم)، (سنن ابى داود)، (سنن الترمزى)، (سنن ابن ماجه)، (مسند أحمد).
٥. منهاج شرح صحيح مسلم، نووى.
٦. التصريح بما تواتر في نزول المسيح الشيخ محمد أنور شاه الكشميري الهندي.
٧. تفسير إبن كثير.